ڕاڤە و لێکدانەوە پەرتووکی

# كَشْفُ الشُّبُهَات

نووسینی

شێخی ئیسلام محمدی کوڕی عبدالوهاب

ڕاڤە و لێکدانەوەی

مامۆستا خۆڵاو -الله بە بەهەشتی شاد بکات-

2016 – 1437

**پێشەکی ماموٚستا کوڕی خاك**

بِسمِ اللهِ الرَّحمَن الرَّحيمِ

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وعلى اله وصحبه ومن ولاه أما بعد:

**الحمدلله بۆ الله تعالى توانیمان له زنجیره وانەکانی کەناڵی تلگرامی ﴿ کوڕی خاك ﴾ ڕیسالەیەکی تری شێخی ئیسلام محمدی کوڕی عبدالوهاب بڵاوبکەینەوە له ڕاڤەکردن و لێکدانەوی ماموٚستا ﴿ خوٚڵاو ﴾ الله به بەهەشتی شاد بکات , که له مانگی ڕەمەزانی ساڵی 1437 کۆچی شەرحی کردووه , داواکرارم له الله تعالە به گشت وشەیەکی بۆ شەرحی ئەم ڕیسالەیە پلەی بەرزبکاتەوە له بەهەشت , یەکێك له درووشمەکانی ماموٚستا خوٚڵاو ئەوەبوو ﴿ ئەگەر هەموو دونیا دوژمنی ئیسلام بێت ئەوە من دوژمنی هەموو دونیام ﴾ الحمدلله به کردار ئەوەی سەلماند , الله تعالى لێ وەرگرێت که ساڵانێکی زۆر له توٚڕە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ کۆمەڵی برا و خوشکی یەك خوا پەرست بانگەوازیان بۆ ئەم ئیسلامە کردووە الله لێیان وەرگرێت و به بەهەشتیان شاد بکات و به زوترین کات ئێمەش بگەیەنێت بەوان و به کاروانی موجاهیدان و شەهیدان و پیاوچاکان .... اللهم امین**

**براتان : کوڕی خاك**

2019 – 1440

#وانـەی( 1 ) #لـەشـیـکـردنـەوەی #پـەرتـووکـی"#كَشْفُ_الشُّبُهَات"

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَن الرَّحيم..

پـێـشـەکـی

كَشْفُ_الشُّبُهَات :واتە:ئاشكرا كردن و لادانی ئەو مەسەلانەی جێی گومانن لای خەڵکی نەشارەزا،مەبەست لادانی ئەوگومان و شوبهانەیە کە لەناو خەڵکیدا بلاو بوونەوە.لەبارەی ئەولیاپەرستی،هاوار و هانابردن بۆ ئەوان،ئەمەش لەدوای سەردەمە چاکەکانەوە بەهۆی شیعەگەری و صۆفیگەریووە بەناو خاکی موسڵمانانددا بلاو بوویەوە

سـەرەتـا دێـن بـاسـی تـوحـیـد و یـەک خـوا پـەرسـتـی دەکـەیـن #دواتـر دێـن رەدی گـومـانـەکـانـی مـوشـریـکـان دەدەیـنـەوە.بە ئیزنی خوا........

مـتـن

قَالَ الشَّيخُ الإسْلَامِ مُحَمد بْنُ عَبْدالوَهَاب...إعْلَم رَحِمَكَ الله.أَنُّ التَّوحيدَ هُو إفْرادُالله سُبْحَانَه وَتَعَالي بِالعِبَادَة،وَهُو دِينُ الرُّسُل،الذِي أَرْسَلَهُمُ الله بِهِ إلي عِبَادِهِ،فَأَوَّلَهُم نوح عَلَيْهِ السَّلاَم،أَرسَلَهُ اللهُ إلَي قَوْمِهِ لَمَّا غَلَوْا فِي الصُّالِحين:وَدَّاً،وَسُواعَاً،وَيَغُوثَ،وَيَعوقَ،وَنَسْرَاوَآخِر الرُّسُل مُحَمد صل الله عليه وسلم،وَهُوَ الذي كَسَّرَ صُورَ هَؤَلاَءِ الصَّالِحِين،

---

#شـیـکـردنـەوە:👇

#بـڕگـەکـەی:یـەکـەم:

بـانـگـەوازی تـەواوی پـێـغـەمـبـەران بـۆ ئـەوە بـووە،کـە #الله بـەتـەنـهـا بـپـەرسـتـرێـت:▼

شێخ دەفەرموێت:

"بـزانـە خودا ڕەحمت پێ بکات بەوەی کە لەرابردووەکانت خۆش بێت،لەمە و دواش هیدایەتت بدات بج کاری چاکە و بەردەوامت بکات:کە #تەوحید:تایبەتکردن و بەتەنها کردنی #الله یە لەگشت جۆرەکانی عیبادەت و پەرستنەکاندا،ئەوەش دینی تەواوی پێغەمبەرانە،سەلامی خوایان بێت لەسەر،

#واتە:توحید=عەقیدە و گووتە و کردەوەی هەر هەموویانە،#واتە:ئەو پێغەمبەرانە بۆ ئەوە نەهاتوون کە بەخەڵکی بڵێن:ئەی خەڵکینە بزانن کە تەنها الله خالقی ئێوەیە تەنها ئەو پەروەدریگارە،و هەموو شتێکی بەدەستە،چوونکە کافرەکان باوڕیان بەوە هەبوو،،خوداش تەواوی ئەو پێغەمبەرانەی بەو تەوحیدەوە ناردووە،بۆ گشت عەبدەکانی جا یەکەمیان(نوح)ە سەلامی خوای لەسەر،خودا رەوانەی کرد بۆ ناو قەومەکەی،کاتێ زیادەڕۆیان کرد لەبارەی پیاو چاکان و خودا پەرستەکانەوە،کە پێنج پیاوچاک بوون،(وەد و سواع و یەغوس و یەعوق و نەسر)

ئەخیری ئەو پێغەمبەرانەش(محمد)صل الله علیه وسلم.بوو،کە رەسم و پەیکەری ئەو پیاوچاکانەی لەساڵی فەتحی مککەدا واتە لە هەشتی کۆچیدا شکاند

#دوو_تـێـبـیـنـی

🔗#جـیـاوازی_چیـە_لەنێوان_نـەبی_و_رسول؟

وەڵام : #یەکەم :ڕەسوڵ بەشەریعەتێکی تازە هاتووە،بەڵام،نەبی لەسەر شەریعەتی پێغەمبەرەکەی پێش خۆی بووە و دەڕوات

#دووەم:ڕەسوڵ ڕەوانە کراوە بۆ قەومی کافران،بەڵام نەبی رەوانە کراوە،بۆ ناو قەومی ئیمانداران،

🔗#بـۆچـی_ووتـی_یـەکـەم_ڕەوانەکراو

#نـووحـە_پێش_ئەو_ئادەم_هەبووە؟

زانایان دەفرموون: بابە ئادەم،رەسول نەبووە.بەڵکو نەبی بووە..بەبەلگەی ئایەتی "٧"سورەتی الاحزاب،کەخوای گەورە دەفرموێت( وِإذْ أَخَذْنَا ِمنَ النَّبِيينَ مِيثَاقَهَم وِمنْكَ ومِن نُوح........)

وانەی( 2 ) #لە_شیکردنەوەیپەرتووکی "كَشْفُ_الشُّبُهَات"

#برگەی_دووەم:

عەقیدە و کردەوەی ئەوانەی کە پێغەمبەریان صل الله علیه وسلم.بۆیان ڕەوانە کرابوو:

أَرْسَلَهُ اللهُ إلي أُنَاسٍ يَتَعَبَّدُونَ،وَيَحُجُّونَ،وَيَتَصَدَّقُونَ،وَيَذْكُرُ اللهُ، وَلَكِنَّهُم،يَجْعَلونَ بَعْضَ المَخْلُوقينَ،وَسَائِطَ بَيْنَهُم وَبَينَ اللهِ،يَقُولونَ:نُريدُ مِنْهُم التَّقَرُبُ إلَي اللهِ،وَنَريدُ شَفَاعَتَهُم عِندَهُ،مِثْلُ المَلاَئِكَةَ وَعِيسي،وَمَرْيَمَ،وَأُناسٍ غَيْرِهِم مِنَ الصَّالِحين

---

#ڕوون_کردنەوە

"خودا ئەو پێغەمبەرەی ناردووە (محمد)صل الله علیه وسلم بۆ لای کەسانێک،کە خودا پەرستیان دەکرد،حەجی مالی خودایان دەکرد،خێر و سەدەقەیان دەکرد،زیکر و یادی خوایان دەکرد بەزۆری،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە درووستکراوەکانی خودای گەورەیان کردبوو بە واسیتە و گەیەنەر لەنێوان خۆیان و خودا،دەیانگۆت دەمانەوێت بەم کارەمان خۆمان لەخودا نزیک بکەینەوە و دەمانەوێت ئەو پیاو چاک و صالحانەی لای خودا شەفاعەتیان بۆ بکەن وەک:ملائیکەتەکان و عیسای کوڕی مریم و کەسانی تر لەغەیری ئەوانە کە پیاوچاک بوون وەک:لات کە پیاوچاکێک بووە خواردنی بەسەر حاجیاندا دەبەش دەکرد

فَبعَثَ اللهُ مُحَمَّداً صل الله عليه وسلم،يُجَدِّدُ لَهُم دينَهُم أَبيهُمْ إِبْرَاهِيمَ،وَيُخْبِرُهُم أَنَّ هَذَا التَّقَرُّب وِالإعْتِقادُ مَحْضُ حَقُّ اللهُ،لاَيَصْلُحُ مِنْهُ شَيءٍ لِغَيْرِهِ لاَلِمَلَكٍ مُقَرَّب،وَلاَ نَبيٍّ مُرْسَل،فَضلاً عَنْ غَيْرِهِمَا

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"خوداش محمدی ڕەوانە کرد صل الله علیە وسلم،کە دین و پەیامی ئیبراهیمی باوکیان بۆ تازە بکاتەوە و زیندوو بکاتەوە،وە خەبەریان پێ بدات کە ئەم خۆ نزیککردنەوەیە لە پیاو چاکان و ئەو جۆرە عەقیدەیە پێ بوونە،تەنها ماف و حەقی خودایە،هیچ کام لەو کارانە بۆ غەیری خودا ناگونجێت،جا چ جای ئەوەی کە بۆ غەیری ئەوان ئەنجام بدرێت،

وَإلاَّ فَهَؤُلاَءِ المُشْرِكونَ،يَشْهَدونَ أَنَّ الله هُوَ الخَالَق وَحْدهُ لاَشَرِيكَ لَهُ،وَأَنَّهُ لاَيَرْزُقُ إلاَّ هُو،وَلاَيُحْيي وَلاَ يُميتُ إلاَّ هُوَ،وَلاَ يُدبِّرُ الأَمْرَ إلاَّ هُو،وَأَنَّ جَمِيعَ السَّمَاواتِ السَّبْعِ،وَمَن فِيهِنَّ،وَالأَرْضِينَ السَّبْعِ وَمَنْ فِيهَا كُلُّهُم عَبيدُهُ،وَتَحْتَ تَصَرُّفِهِ وَقَهْرٍ

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"خۆ ئەگەرنا ئەو موشریکانە شایەدیان دەدا کە #الله هەر خۆی درووستکەرە و هیچ هاوبەشێکی نییە،هیچ کەس ڕۆزیدەر نیە تەنها ئەو نەبێت،هیچ کەس ژیان نابەخشێت تەنها ئەو نەبێت،هیچ کەس مەرگ ناهێنێت تەنها ئەو نەبێت،هیچ کەس کارو بار بەڕیوە نابات تەنها ئەو نەبێت،وە ئەو کافرانە عەقیدەشیان وابوو کە هەموو ئاسمانەکان و هەرچیان تێدایە و هەموو زەمینەکان و هەرچیان تێدایە،هەموویان عەبدی خودان و لەژێر دەسەلات و قەهری خودا دان

فَإِذَ أَردتَ الدَّليلُ عَلي أَنَّ هَؤلاءِ المُشْركينَ الذينَ قَاتَلَهُم رَسولَ اللهِ صل الله عليه وسلم،يَشْهَدُونَ بِهَذَا فَاقْرَأَ قَوْلِهِ تَعالي(قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَلأَرْضِ أَمَّن يَمْلِك السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الحَيَّ مِنَ المَيِّتِ وَيُخْرِجُ المَيِّتَ مَنَ الحَي وَمن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقولونَ الله،فَقُل أَفَلاَ تَتَّقون)يونس ٣١

---

#ڕوون_کردنـەوە

"جا ئەگەر بەڵگەت دەوێ لەبارەی ئەوەی کە ئەو موشریکانەی کە پێغەمبەری خوا صل الله علیه وسلم،جەنگی لەگەڵدا کردن،شایەدیان دەدا لەسەر ئەوشتانە،ئەگەر بەڵگەت دەوێت،لەبارەی ئەو مەسەلە گرنگەوە،ئادەی ئەو ئایەتە بخوێنیەوە👆واتە(لەو کافرانە بپرسە کێ رزقی ئێوە دەدال لەئاسمانەکان و زەوی؟ یان کێ گوێ و چاوەکانی درووستکردووە و بەئێوەی بەخشیوە؟یان کێ زیندووەکان لە مردووەکان دەردێنێ"وەک:گژوگیا لەزەوییەکی مردوو دەردێنێ"؟یان مردوو لە زیندوو دەردێنێ"وەک:هێلکە لە مریشک دەردێنێ"؟ یان ئەوە کێیە هەموو کارو باری ئاسمانەکان و زەوی دەبات بەڕێوە،بە تەئکید ئەو کافرانە لەوەڵامدا دەڵێن #تەنها_الله

دە تۆش پێیان بلێ:ئەی کافرەکان مادام زانیتان کە تەنها #الله ئەو کارانە دەکات،ئەی بۆچی خۆتان ناپارێزن لە سزای خوا،بەوەی کە عیبادەتەکان تەنها بۆ #الله ئەنجام بدەن و هیچ شتێکی دیکە نەکەن بە شەریکی خودا

وَغَيْرُ ذَالِكَ مِنَ الآيَاتِ......

---

جگە لەو ئایەتانە چەندین ئایەتی تر هەن کە ئەم باسەیان روون کردۆتەوە.......

وانـەی ( 3 ) #لـەشـیـکـردنـەوەی پـەرتــووکـی "#كَشْفُ_الشُّبُهَات"

#بـڕگـەی_سـێـیـەم:

👋ئـەو تـەوحـیـدەی کـە کـافـرەکـان ئینکاریـان لـێـکـرد و لـەسـەری جـەنـگ دژیـان بـەرپـا کـرا،تـەوحـیـدی یـەک خـودا پـەرسـتـی بـوو(تَوْحِيدُ الأُولُوهِيَّة)👋

مـتْـن

إِذَا تَحَقَّقْتَ أَنَّهُم مُقِرُّونَ بِهَذَا، وَلَم يُدْخِلْهُم فِي التَّوْحيد الذي دَعَاهُم إِلَيْهِ رَسُولُ اللهِ صل الله عليه وسلم

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"جا مادەم بۆت دەرکەوت بەپێی ئەو بەڵگانەی کە ئەوان دانیان دەنا بەوەدا #الله هەرخۆی پەروەردیگارە،بەوەش نەهاتنە ناو تەوحیدەوە کە پێغەمبەری خوادا بانگەوازی بۆ کردن کە تەوحیدە لە ئەنجامی پەرستنەکاندا واتە(تَوْحيد آلألُوهِيَة)

وَعَرَفْتَ أَنَّ التَّوْحِيدَ الذي جَحَدُوهُ هُوَ تَوْحِيدَ العِبَادَةَ،الذي يُسَمِيهِ المُشْرِكونَ فَي زَمَانِنَا الإِعْتِقَاد،كَمَا كَانوا يَدْعونَ اللهَ سُبْحَانَ الله وَتَعالي لَيْلاَ وَ نَهَارا،ثُمَّ مِنهُم مَنْ يَدْعُوا اللهَ لأَجْلِ صَلاَحِهِم،وَقُرْبِهِم مِنَ اللهِ لَيَشْفَعوا لَهُ،أَوْ يَدْعُوا رَجُلاً صِالِحَاً مِثْلُ اللاَّتَ أَوْ نَبَيّاَ مِثْلُ عِيسي

---

#ڕوون_کردنەوە

"زانیشت کە ئەو تەوحیدەی کە ئەوان ئینکاریان لێدەکرد تەوحیدی عیبادەت بوو،کە موشریکەکانی ئەو زەمانە"واتە:زەمانی شێخ محمد" پێی دەڵێن #عەقیدە پێ بوون،واتە کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر صل الله علیه وسلم،عەقیدەیان وابوو هەرکەسێ عەقیدەی بە هەرشتێ هەبێت و هاواری لێ بکات قوربانی بۆ بکات ئەوا ئەو شتە کارەکەی بۆ ڕایی دەکات،جا لەسەردەمی پێغەمبەردا بەو شتە دەگووترا "ئیلاهـ" لەسەردەمی شێخ محمد دا پێی دەگووترا عەقیدە بوون بەو شتە،لای خۆشمان هەر وایە،فەقەت ناوەکەی جیایە،پێی دەڵێن عاقیبە بوون،بە پەرستراوەکانیشیان دەڵێن ڕۆحانەتی ئەو لیاکان

هەروەک ئەو موشریکانە شەو رۆژ خودا پەرستیان دەکرد و داوای پێویستیەکانیان لە خودا دەکرد

جا هەیان بوو ملائیکەتی دەپەرست،چوونکە ملائیکەتەکان صالحن و لە خوا نزیکن،بۆ ئەوەی لای خودا شەفاعەتیان بۆ بکەن

یان داوایان لە پیاوچاکان و صالحان دەکرد کە پێویستیەکانیان بۆجێ بەجێ بکات وەک "لات"

یان داوایان لە پێغەمبەرێک دەکرد و پەرستنیان بۆ دەکرد وەک عیسا"

وَعَرفْتَ أَنَّ رَسُولُ الله صل الله عليه وسلم،قَاتَلَهُمْ عَلَي هَذَا الشّرْك وَدَعَاهُم ألي إخْلاَصِ العِبَادَةَ لِلهِ وَحْدَه

---

#ڕوون_کردنەوە

"زانیشت کە پێغەمبەر صل الله علیه وسلم،لەسەر ئەم شیرکە جەنگی لەگرڵدا کردن،وەبانگی کردن کە هەموو جۆرەکانی عیبادەت تەنها #الله ئەنجام بدەن

کَمَا قَالَ تَعَالي(فَلاَ تَدْعوا مَعَ اللهِ أَحَدَا)الجن ١٨

وَقَالَ (لَهُ دَعْوَةُ الحَقُ وَالذينَ يَدْعُونَ مِن دونِهِ لاَ يسْتَجِيبونَ لَهُم بِشَيءٍ)

---

#ڕوون_کردنەوە

"خوای گەورە دەفرموێت(واتە:نەکەن داوا لەهیچ کەسی دیکە بکەن و پەرستنی بۆ ئەنجام بدەن)الجن ١٨

وە دەفرموێت(واتە:هەرچی پەرستن و داواکردنی بەحەقە کە شیرکی تێدا نەبێت تەنها ئەوە بۆ #الله یە،ئەوانەش کە موشریکەکان داوایان لێدەکەن و عیبادەتیان بۆ ئەنجام دەدەن،هیچ جوابیان نادەنەوە،واتە:نە زیانیان هەیە نە سوود،ئەمەش وەک ئەو کەسە وایە کە پەنجەکانی دەستی بلاو دەکاتەوە و دەیکات بەناو ئاودا دەییات بۆ دەمی)

وَتَحَقَّقْتَ أنَّ رَسُولُ اللهِ صل الله عليه وسلم،قَاتَلَهُم لِيَكونُ الدُّعَاءُ كُلُّهُ لِلهِ،وَالذَّبْحُ كُلُّهُ لِلهِ،وَالنَّذْرُ كُلُّهُ لِلهِ،وَالإسْتِغَاثَةُ كُلَّهَا بِاللهِ وَجَمِيعَ أَنْوَاعَ العِبَادَات كُلَّهَا لِلهِ

---

#ڕوون_کردنەوە

"بۆشت ئاشکرا بوو کە پێغەمبەری خوا صل الله علیه وسلم،جەنگی لەدژیان بەرپا کرد،بۆ ئەوەی هەموو جۆرەکانی داوا کردن تەنها بۆ #الله بێت،هەموو جۆرە نەزرێک تەنها بۆ #الله بێت،سەربڕینەکان و قوربانیەکان تەنها بۆ #الله بێت،

داواکردن بۆ رزگاری کردن لەتەنگانا ،هەموو جۆرەکانی کەم و زۆری تەنها بۆ #الله بێت،گشت جۆرەکانی عیبادەت تەنها بۆ #الله بێت

وَعَرَفْتَ أَنَّ إِقْرارَهُم بِتَوْحِيدِ الرُّبُوبيّةَ لَمْ يُدْخِلْهُم في الإسلاَم،وَأَنَّ قَصْدَهُم المَلاَئِكَةَ،أَوْ الأنْبياءْ،أَوِ الأَولياء يرِدُونَ شَفَاعَتُهُم،وَالتَّقَرُّبُ إلي اللهِ بِذَالكَ هُوَ الذي أَحَلَّ دِمَاءَهُم،وَأموالَهُم،وَعَرَفْتَ حِنَئِذٍ التَّوحيد الذي دَعَتْ إلَيْهِ الرُّسُل،وَأبَي عَنِ الإقْرارِ بِهِ المُشْرِكون

---

#ڕوون_کـردنـەوە

،زانیشت کەدانیان دەنا بەوەدا کە #الله هەرخۆی پەروەردیگارە،و هەموو شتێکی بەدەستە،بەم عەقیدەیە نەهاتنە ڕیزی ئیسلامەوە،ئەوەشت زانی کە داوایان لە فریشتەکان دەکرد یان لەپێغەمبەران یان ل

وانـەی ( 4 ) #لـە_شـیـکـردنـەوەی پـەرتـووکـی "#كَشْـفُ_الشُبُـهَـات"

#بـڕگـەی_چـوارەم:

"مـوشـریـکـەکـان مـانـای(#لاَالهَ_الاَّ_الله) یـان دەزانـی!":

مـَتـْن

وَهَذَا التَّوْحيد هُوَ المَعْنَي قَوْلِكَ (#لاَالهَ_الاَّ_الله):فَإِنَّ الإلهَ عِنْدَهُم هُوَ الذِي يُقْصَدُ الأَجْلَ هَذِهِ الأُمور،سَوَاءَ كَانَ مَلَكَاً،أَوْ وَلَيَاً،أَوْ شَجَرَةٍ،أَوْ قَبْرَاً،أوَجِنيَّاً،أَم يُريدونَ أَنَّ(الإله) هُوَ الخَالق الرَّزَاقُ المُدَبِّر،فَإِنَّهُم يَعْلَمُونَ أَنَّ ذَالِكَ لِلهِ وَحْدَهُ كَمَا قَدَّمْتُ لَكَ،وَإِنَّمَا يَعْنونَ بـــ(الإله) مَا يَعْني المُشْرِكونَ فِي زَمَانِنَا بِلَفْظِ(السَّيِد)فَأَتَاهُم النَّبيِّ صل الله عليه وسلم،يَدْعوهُم أِلي كَلِمَةٍ التَّوْحيد،وَهِيَ (#لاَالَهَ_الاَّ_الله)

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"ئەم تەوحیدە کە تەوحیدی یەک خوا پەرستیە(التوحيد الأولوهية)هەمان مەعنای(لا اله الا الله)یە چوونکە"ئیلاهـ"لای کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر صل الله عليه وسلم،واتە:ئەو کەسەی کە جێی نیازە و ئەو کارانەی بۆ ئەنجام دەدرێت،کە پێیان دوگووترێت،عیبادەت فەرقی نییە جا ئەو کەسە ملائیکەت بێت یان پێغەمبەرێک،یان وەلییەکی خوا،یان پیاوچاکێک بێت یان قەبرێک بێت یان جنۆکەک بێت،

کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر کە گووتیانە پەرستراوەکانمان "ئیلاهن"مەبەستیان ئەوە نەبووە کە ئەو پەرستراوانە خالقن یان ڕزقی خەڵک دەدەن یان کار و باریان بەدەستە،چوونکە ئەوان دەیانزانی کە ئەوکارانە تەنها کاری خودان،

بەڵکو مەبەستیان لە "ئیلاهـ"هەر ئەوە بووە کە موشریکەکان لەم سەردەمەدا پێی دەڵێن"سەید"یان پێی دەڵێن"شێخ"یان"ئەولیا"یان"غەوس"

پێغەمبەریش هات بۆلایان بانگوازی ئەوانی کرد بۆ بەدیهێنانی تەوحید کە ئەویش(لا اله الا الله) یە مەبەستیش لەم وتەیە مەعناکەیەتی نەک تەنها گووتنی سەرزارەکی

#ڕوونـکـردنـەوەکـی_گـرنـگـ👇

"ئـیـلاهـ" واتە: ئەوکەسەی جێی نیازە و مەقصودە لە ئەنجامدانی ئەو گوتە و کردەوانەدا کە بە عیبادەتکردن حسێبن،ئەمەش یەکدەنگی لەسەرە لەلایەن زمانناسانی عەرەبییەوە،

لای ئەهلی سوننەش هەروایە "ئیلاهـ"واتە:پەرستراوی جێی مەبەست:ئەو کەسەیە کە هەر جۆرە عیبادەتیکی بۆ ئەنجام دەدرێت

بەڵام ئەشعەرییەکان و صۆفییەکان و جەهمییەکان و ڕافیزەکان و سەردەم پەرستەکان دەلێن"ئیلاهـ" واتە:پەروەردیگار واتە:خالق

بەپێی ئەم "عەقیدەیە" موشریکەکان دێنە ڕیزی تەوحیدەوە

ئەمەش مەترسیدارترین لادانە لای ئەشعەرییەکان و غەیری ئەوانیش لە ئەهلی بیدعە،چوونکە ئەوان "ئیلاهـ"بەواتای پەروەردیگار لێک دەدەنەوە

#د_عبداللطيف_بن_عبدالرحمان_بن_حسن

دەفرمووێت(موشریکەکانی زوو مەبەستیان لەوتەی"ئیلاهـ"هەر ئەوەیە کە خەڵکی ئەم سەردەمە پێی دەلێن"سەید" چوونکە سەید لای زۆرینەی موشریکەکانی ئەم سەردەمە،ئەو کەسەیە کە داوای لێدەکرێت و لە تەنگانەدا هاواری بۆ دەبردرێت،لەکاتی بەڵاو موسیبەتا جێی ئومێدەوە سوێندی پێ دەخورێت،هەندێک پێی دەلێن"وەلـی"هەر وەک لە زمانی زۆرێک لە میسرییەکان وایە،)

#مِنْهَاجُ_التَّأْسيس_صفحة_٣١٣_٣١٤

#ابن_مـانـع دەفرمویێت(مەبەستی دانەر لە "سەید"ئەوەیە کە نەفامەکان عەقیدەیان هەیە بەهەندێک کەسی دەججال و درۆزن و دەستبڕ بەناوی شێخ و مەلا و تەریقەتەوە،ئەوانەی کە خەڵکی عەوام فریودەدەن کە گوایە،خاوەنی کەرامەتن و دەتوانن کار و بار و پێویستیەکانی خەڵکی جێ بەجێ بکەن،پێویستە خەڵکی پەنا بەوان ببەن و داوایان لێ بکەن و بەهۆی ئەوانەوە خۆیان لە خودا نزیک بکەنەوە،خەڵکی عەوام بەم دەجالانە دەلێن"سەید" ئەمەش روون و ئاشکرایە و لەناو خەڵکیدا دەبینرێن،مەبەستی #شێخ_محمدی_کوڕی_عبدالوهاب ئەوەیە بەرەحمەت بێ

وانـەی ( 5 ) #لـە_شـیـکـردنـەوە پـەرتـووکـی "#كَـشْـفُ_الـشُّبُـهَـات"

#بـڕگـەی_پـێـنـجـەم:

نـاکـۆکـی خـەڵـکـی لـەبـارەی مـەعـنـای پـەرسـتـراویـەوە"الأولوهية":

وَالمُرَادُ مِنْ هَذِهِ الكَلِمَةَ مَعْنَاهَا لاَمُجَرَّدُ لَفْظِهَا ،وَالكُفَّار الجُهَّال يَعْلَمون أَنَّ مُرَادَ النَّبِيَّ صل الله عليه وسلم،بِهَذِهِ الكَلِمَةْ هُوَ إِفْرَادُ الله تَعَالي بِالتَّعلق،وَالكُفْرِ بِمَا يُعْبَدُ مِن دونِ اللهِ ،وَالبَراءَةُ مِنْهُ،فَإِنَّهُ لَمَّا قَالَ لَهُم:(قولوا: لاَالهَ الاَّ الله) قَالوا (أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيءٌ عُجَاب)

---

#ڕوونـ_کـردنـەوە

"ئەوەی کە داوا کراوە لە گوتنی"لاله الا الله"دا قبوڵکردنی مەعنایەکەیەتی نەک تەنها گوتنی بەدەم،کافرە جاهیلەکان دەیانزانی کە مەبەستی پێغەمبەر صل الله علیه وسلم،بەم کەلیمەیە ئەوەیە: کە #الله بەتەنها دابنرێت لەوەدا کە ئینسان لەهەموو ڕوویەکەوە پەیوەست بێت تەنها بەخوداوە،لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کافر بێت بەپەرستنی هەرچییەک کە هەرجۆرە پەرستنێکی بۆ بکرێت جگە لە #الله وە دەبێت خۆشی لێ بەری بکات،چوونکە کاتێ بەوانی گووت بڵێن :لاَالهَ الاَّ الله گووتیان : ئایە ئەم هەموو پەرستراوانەی کەم کردەوە و کردنی بەیەک پرستراو کە تەنها #الله بێت بەڕاستی شتێکی سەیرە!"

فَإِذَا عَرَفْتَ أَنَّ جُهَّالَ الكُفَّار يَعْرِفونَ ذَالِكَ،فَالعَجَب مِمَّن يَدَّعي الإِسْلاَمَ وَهُو لاَيَعْرُفُ مَن تَفْسير هَذِهِ الكَلِمَة مَاعَرَفَ جُهَّال الكُفَّار،بَلْ يَظُنُّ أَنَّ ذَالِكَ هُوَ التَّلَفُظ بِحُرووفِهَا مِن غَيْرِ اعْتِقَادِ القَلْبِ لِشَيءِ مِنَ المَعَاني

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"جا کە زانییت کافرە نەفامەکان ئەمەیان دەزانی،عەجیب ئەوەیە کەکەسانێک دیعایەی ئیسلامەتی بۆ خۆیان دەکەن،بەڵام تەفسیری ئەم کەلیمەیە نازانن،بەو جۆرەی کە کافرە نەفامەکان دەیانزانی،سەرەڕای ئەوەش وا گومان دەبەن و وەها

دەزانن کە ئیسلامەتی هەرئەوەیە کە پیتەکانی "لآالهَ الاَّ الله" بەدەم بگوترێت،بەبێ ئەوەی لەدڵەوە باوەڕی بەهیچ کام لە مەعنایەکەی ببێت"

وَالحَاذِقُ مِنْهُم يَظُنُّ أَنَّ مَعْنَاهَا: لاَيَخْلقُ،وَلاَيَرْزُقُ،وَلاَ يُدْبِّر الاَّ الله،فَلاَ خَيْرَ فِي رَجُلٍ جُهَّال الكُفَّار أَعْلَمُ مِنْهُ بِمَعَاني "لآالهَ الاَّ الله"

---

#ڕوون_کردنەوە

"کامەیان شارەزا و زیرەکە گومانی وایە کە "لآالهَ الأَّالله" واتە: هیچ کەس درووستکار نییە جگە لە #الله وە هیچ کەس ڕزق نادات جگە لە #الله هیچ کەس کاروبارەکان بەڕێوە نابات جگە لە #الله

جاکەواتە هیچ جۆرە خەیرێک لە پیاوێکدا نییە کە کافرە جا هیلەکان لەبارەی "لآالهَ الاَّ الله" لەو کەسە شارەزاتر و زاناتر بن

#ڕوونکردنەوەیەکی_زۆر_گرنگ!؟👇

شێخ_محمدی_کوڕی_عبدالوهاب خەڵکی_دابەش_دەکات_بۆ_٣_بەش!

#جۆری_یەکەم:

مەعنای ئەو کەلیمەیە دەزانێت بەڵام کاری پێ ناکات،پەرستنەکانی تەنها بۆ #الله ئەنجام نادات، #ئەوانە_موشریکن

#جۆری_دووەم:

عەقیدەی وایە کە مەعنای"لآالهَ الاَّ الله"تەنها ئەوەیە کە بەدەم بیڵێیت و هیچی تر،هەرکەس بڵێ"لآالهَ الاَّ الله " لای ئەوان موسڵمانە،ئەم فەرموودەیە دەکەن بەبەڵگە(من قال لااله الا الله دخل الجنة)جا ئەگەر بە قسەی ئەوان بێت هەرکەس بەدەم بیڵێت و کاری پێ نەکات،موسڵمان بێت،ئەوا مونافیقەکانیش موسڵمانن،چوونکە مونافیقەکانیش،دەیانگوت بەڵام خودا دەفرموێت(إِنَّ المُنَافقينَ في الدَّرْكِ الأسْفَلِ مِنَ النَّار)النساء ١٤٥

واتە:مونافیقەکان لە پلەی هەرە خوارێی ئاگرن

#جۆری_سێیەم:

زورینەی خەڵکی دەگرێتەوە کە وا دەزانن کە معنای پەرستراوی"الأولوهية" هەمان مانای پەروەدیگاری"الربوبية" هەیە،ئەمەش

#ئەشعەرییەکان و #جەهمیەکان و #ڕافیزەکان و #قەبرپرستان و #صۆفییەکان دەگرێتەوە

#ڕەدی_ئەوانیش_بەم_جۆرەیە!👇

١_عەرەبە موشریکەکان دانیان بەوەدا دەنا کە تەنها #الله پەروەردیگارە،بەڵام دانیان بەوەدا نەدەنا کە تەنها #الله پەرستراوە.(قُل أعُوذُ #بَرَبِّ النَّاس*١*مَلَكِ النُ ِاس*٢* #الهِ_النَّاس)

ئەگەر #رەب و #ئیلاهـ یەک شت بن دووبارە نەدەکراوە لەم ئایەتانە

٢_زانایانی زماننانسی عەرەبی (عُلَمَاء اللغَة العَربية)یەک دەنگن لەسەر ئەوەی کە #رەب و #ئیلاهـ دوو مەعنای جودایان هەیە

٣_ئەهلی تەفسیریش هەروا دەڵێن

وانـەی( 6 ) لـەشـیـکـردنـەوەی پـەرتـووکـی "کَشْفُ_الـشُّبُـهَات"

بڕگـەی_شـەشـەم:

دڵـخـۆش بـوون بـە نـاسـیـنـی تـەوحـیـد و نـاسـیـنـی پـێـچـەوانـەکـەی بـەجـوانـی



إذَا عَرَفْتَ مَا ذَكَرَت لَكَ مَعْرِفَةَ قَلْبٍ وَعَرَفْتَ الشِّرْكَ بِالله الذي قَالَ اللهُ فِيهِ(اِنَّ اللهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَادونَ ذَالِكَ لِمَن يشَاء) النساء ٤٨ وَعَرَفْتَ دينَ اللهِ الذي أُرْسِلَ بِهِ الرُّسُل مِن أَوَّلِهِم إلي آخِرِهِم،الذي لاَ يَقْبِلُ الله مِن أحَدٍ سِوَاه،وَعَرَفْتَ مَا أَصْبَحَ غَالِبَ النَّاسَ عَلَيْهِ مِنَ الجَهْلِ بِهَذاَ أَفَادَكَ فَائِدَتَين: الاولي_ الفَرح بِفَضلِ الله وَرَحْمَتِهِ،كَمَاقَالَ تَعالي(قُل بِفَضْلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ،فَبِذَالِكَ فَاليَفْرَحُوا هُوَ خَيرُ مِمَّا يَجْمَعون) يونس ٥٨ الثاني_ الخَوْفُ العَظيم

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"مادەم تۆ ئەم شتانەت زانی:

#یـەکـەم_ ئەوەی کە بۆتم باس کرد لە کانگای دڵـەوە زانیت،زانینێکی ڕاست و درووست(واتە:لەدڵـەوە زانیت و بەڕاستت زانی لە دڵیشەوە کارت پێکرد واتە: مەرجەکانی"لاَالهَ الاَّ الله"ت لەدڵـەوە لە خۆتا هێنایە دی

#دووەم_ شیرکیشت ناسی ئەوەی کە خودا لە بارەیەوە فەرموویەتی(واتە:بەتەئکید خودا لەوە خۆش نابێت کە شەریکی بۆ دابنرێت،جگە لەوە لە هەر گوناهێکی دیکە خۆش دەبێت،لەهەرکەسێک کە بیەوێ)

واتە ئەگەر هەر ئینسانێ لەسەر شیرکی گەورە بمرێ نەخودا لێی خۆشەبێت،نە دەیخاتە بەهەشتەوە

بەلام شیرکی بچوک: قەولی ڕاجیح ئەوەیە ئەگەر لەسەر شیرکی بچوک بمرێت ئەوا خودا لێی خۆش نابێت چونکە شیرکی بچوک پلەیەکە دەکەوێتە،نێوان شیرکی گەورە و تاوانە گەورەکانەوە،بەلام موسلمانی پێ کافر نابێت و بە هەمیشەیی لەئەگەر نامێنێتەوە

#سـێـیـەم_ دینی خوداشت ناسی ئەو دینەی کە بە پێغەمبەراندا ڕەوانەی کردووە لەیەکەم ڕەسولەوە کە #نوح بووە تا ئاخیرەکەیان کە محمد بووە صل الله علیە وسلم،کە جگە لەو دینە خودا لەهیچ کەسی دیکە قبوڵ ناکات دینێکی دیکەی ببێت

#چـوارەم_ زانیشت کە زۆربەی خەڵکی لەو بارەیەوە نەزان و نەفامن(واتە:نازانن تەوحید چیە و ناشزانن شیرک چییە،واتە بەهەڵە حالی بوون لە تەوحید و شیرک

ئەمەش دوو سوود و پەندی لێوەردەگیرێت

#یـەکـەم:واجبە دڵخۆش بوون بە فەزڵ و بەخششی خودا چوونـکـە:

١_تۆ ئیسلامت ناسی،ناسینێکی ڕاست و درووست،پێچەوانەکەشت ناسی کە شیرکە،چوونکە زانستێکی گەورەت دەستکەوتووە لەبارەی گەورەترین شتەوە کە ئەویش #توحیدە

٢_چوونکە تۆ سلامەت بوویت لەدەست عەقیدە و بیرو باوڕی پوچ و بەتاڵ،ئەوەش ئەوپەڕی دڵخۆشیە

٣_تۆ بەوانە بوویت بە یەکێ لە ئەهلی سوونەت و جەماعەت،و #ئەهلی_تەوحید

و نەبوویت بە یەکێ لە #ئەهلی_شیرک و قەبرپرستان،وەخودا فەرموویەتی( واتە:بلێ بە ئیمانداران تەنها بەم بەخششەی خودا دڵخۆش و شادوومان بن کە قورئانە و مایەی هیدایەتە بۆ گوتەی حەق و کرداری چاکە و سەرنجامەکەشی ڕەحمەتە،دەی با تەنیا بەمە دڵخۆش ببن،نەک بەشتی دیکە ئەمە باشترە لەو ماڵ و سامانەی کە کافرەکان و موشریکان کۆی دەکەنەوە)یونس ٥٨

#دووەمـیـان: ئەوەیە کە زۆر بترسیت لە شیرک کە تێی بکەویت و بە خۆت نەزانیت(واتە بە عیلم و کردار و کردەوەکانت مەغرور نەبیت و هەمیشە لەهەوڵدا بیت بۆ فێربوونی زیاتر لەبارەی #تەوحیدەوە و خۆ پاراستن لە ئەنواعی شیرک،چوونکە ئێمە لە پێغەمبەر ئیبراهیم زیاترنین کە هەمیشە لەشیرک دەترسا و دەیفەرموو(وَاجْنُبْني وَبَنِيَّ ان نَعبدَ الاصْنَام)ابراهیم ٣٥

واتە:خودایە من و نەوەکانم لەوە بەدوور بگرە کە بت بپەرستین یان غەیری تۆ بپەرستین

شـهـاب_الـديـن_الـقـرافـی دەفـرمووێت

"ئەم قاعیدە شەرعیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر نەزانێک،هەر کەسێکی موکەلەف(واتە بالغ و عاقل) تواناى هەبوو ئەو زانینەی لەسەر خۆی لابدات،ئەوە ئەو نەزانینە نابێت عوزر و بیانوو بۆ هیچ نەزانێک،چوونکە #الله گیان نێردراوەکانی خۆی بەنامەکانیەوە ناردووە بۆ ناوخەڵکی واجیبیشی کردووە لەسەریان کە خۆیان فێری ئەو نامانە بکەن و پاشان کاری پێ بکەن، کەواتە زانست و کارکردن بەو زانستە دوو واجیبی سەرشانی ئینسانن،و مایەوە بە نەفامی ئەو دوو جار بێ فەرمانی خودای کردووە،چوونکە وازی لەدوو واجب هێناوە

وانـەی( 7 ) لـەشیـکـردنـەوەی پـەرتـووکـی "کَشْـفُ_الـشُّبُـهَـات"

بـڕگـەی_حـەوتـەم:

ئـایـا جـەهل یـان تـەئـویـل لـەشیـرکـی گـەورەدا عـوزرە یـان عـوزر نـیـە؟

فَإنَّكَ إذَا عَرَفْتَ أَنَّ الانسَانَ يَكْفرُ بِكَلِمَةٍ،يُخْرِجُهَا مِن لِسَانِهِ،وَقَدْ يَقولُهَا وَهُوَ يَظُنُّ انُّهَا تُقَرِّبَهُ اللهِ كَمَا ظَنَّ المُشْرِكُونَ،خُصُوصاً انْ الْهَمَكَ اللهُ مَاقَصَّ عَن قَوْمِ موسي مَعَ صَلاَحِهِم وَعِلْمِهِم انَّهُم أَتَوْهُ قَائلين(اجعَلْ لَنَا إلَهاً كَمَا لَهُم آلِهَةٌ)الاعراف ١٣٨

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"چوونکە تۆ کاتێک کە زانیت ئینسان دەبێت بەکافر بەتەنها یەک کەلیمە کە لە زمانی دەردەچێت بێ ئەوەی لەدڵـەوە باوەڕی بەو کەلیمەیە ببێت

"وِقَدْ يَقولَهَا وَهُوَ جَاهِلٌ فَلاَ يَعْذر بِالجَهْل"

هەندێک جار ئەو قسەیە دەکات،کە جاهیلە و نەزانە،بەڵام هیچ عوزرێکی بۆ ناهێنرێتەوە بەوەی کە نەزان بووە،

"وَقَدْ يَقولَهَا وَهُوَ يَظُنُّ انَّهَا تُقَرَّبَهُ الي اللهِ كَمَا ظَنَّ المشركون"

وەهەندێک جار دەڵێیت و وا دەزانێت ئەو کەلیمەیە لە خودای نزیک دەکاتەوە هەروەک موشریکەکان وا گومانیان دەبرد بەشەریک دانان بۆ خودا،لەخودا نزیک دەبنەوە بەوەی کد شەریکیان بۆ داناوە

بەتایبەت ئەگەر خودا ئیلهامی ئەوەی پێدا لەبارەی گەلی موساوە،سەرەڕای ئەوەی کە پیاوچاک بوون و خاوەنی عیلمی شەرعی بوون،ئەوەبوو کاتێ تێپەڕێن بەلای قەومێکدا کە بتیان دەپەرست هاتن بۆلای موسا و گووتیان:(واتە:ئەی موسا پرستراوێکمان بۆ دابنێ هەر وەک چۆن ئەو قەومەش پەرستراوێکیان هەیە) الاعراف ١٣٨

فَحِنَئِذٍ يَعْظُمُ خَوْفُكَ،وَحِرصُكَ عَلي مَايُخَلِّصُكَ مِن هَذَا وَامْثَالِهُ

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"جا کە ئەوانەت زانی ئەو کاتە ترسەکەت گەورە دەبێت و ئەوجا سووردەبیت،لەسەر ئەوەی فێری عیلمێک ببیت و کردەوەیەک فێرببیت کە لەم جۆرە کارانە و هاوشێوەکانی نەجاتت بدات،نەوەک تێی بکەویت و بەخۆت نەزانیت،چوونکە ئەو کاتە هیچ عوزرێکت نابێت،

یەکی لە هۆیەکانی نەجات بوون:

١_ئەوەیە کە وەک حوزەیفە:بگەڕێیت و خۆت فێری عیلمی شەرعی بکەیت

٢_یەکێ تر ئەوەیە داوا لە خودا بکەیت،کە خودا هیدایەتت بدات و هەمیشە بترسیت لەشیرک،هەروەک ئیبراهیم فەرمووی:خودای من و نەوەکانم دوور بگرە لەوەی کە بت بپەرستین یان غەیری تۆ بپەرستین

#بـەڕگـەی_هـەشـتـەم:

هـەمـوو پـێـغـەمـبـەرێـک،خـودا دوژمـنـی بـۆ دانـاون کـە ئـەو دوژمـنـانـە بـەڵـگـەی خـۆیـان پـێـیـە بـۆ دژایـەتـی کـردنـی پـێـغـەمـبـەران و شـوێـنـکـەوتـوەکـانـیـان

وَاعْلَمْ انَّ اللهَ سُبْحَانَهُ مِن حِكْمَتِهِ لَم يَبْعَث نَبِيَّاً بِهَذَا التَّوْحيد الاَّ جَعَلَ لَهُ أعْداءٌ،كَمَا الله قَالَ تعَالي(وَكَذَالِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبيٍّ عَدوّاً شَيَاطينَ الانسِ وَالجِنِّ يوحي بَعْضُهم الي بَعْضَ زُخْرُفَ القَوْلِ غُروراً)الانعام ١١٢

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"بزانە ئەی فێرخوازی عیلمی شەرعی،کە خودا جۆرێک لە حیکمەتەکانی کە تاقیکردنەوەی عەبدەکانیەتی،ئەوەیە کە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت،بەم تەوحیدەوە کە پەرستنی #الله یە بەتەنها،هەر لە نوحەوە هەتا پێغەمبەری خۆمان صل الله عليه وسلم،ئیلا خودا دوژمنێکی بۆ داناوە بۆ ئەو پێغەمبەرانە و بۆ شوێن کەوتووانیان،بەدەم و بەدەست و بەپارە و پول و سامانیان بە هەموو جۆرێک دژایەتی

بانگەوازی تەوحید دەکەن کە بانگەوازی تەواوی پێغەمبەرانە ئەمەش بۆ هەموو کات و شوێنێکە،بەبێ ڕاوەستان

خودای گەورەش دەفرمویێت(واتە:هەر بەو جۆرە کە دوژمنمان بۆتۆ داناوە،بۆهەموو پێغەمبەرێکیش دوژمنمان داناوە،ئەوانەش شەیتانەکانن ئەوانەن کە لە ڕەحمی خوداوە دوورن،جا ئینسان بن یان جینی،هەندێکیان هەندێکی دیکەیان فێری گوتەی بەڕوکەش ڕازاوە دەکەن بۆ ئەوەی یەکتر فریو بدەن و لەخشتە بەرن،ئەگەر پەروەردیگارت بیویستایە نەیدەهێشت دوژمنایەتی ئیمانداران بکەن و ئەو گوتەی ڕازاوە و بەناوەڕۆک گەندەڵانە بلاوبکەنەوە،دەی تۆش وازیان لێ بێنە لەگەڵ ئەوەشدا واز بێنە لەهەموو شتانەی کە ئەوان هەڵیان بەستووە) الانعام ١٢٢

واتە: واز بێنە لە گشت گوتە و بەرنامانە و نوسراوەکانیان"

وَقَدْ يَكونُ الاعْدَاءِ التَّوحيد عُلومِ كَثيرةَ وَكَتَبَ وَحُجَجٌ،كَمَا قالَ تَعالي(فَلَمَّا جاءَتْهُم رُسُلُهُمْ بِالبَيِّنَات فَرِحوا بِمَا عَندَهُم مِنَ العِلْمِ)الغافر ٨٣

---

#ڕوون_کردنەوە

"جا لەوانەیە دوژمنانی تەوحید هەبێت زانیاری و شارەزایی زۆریان ببێت،"وکتب وحجج"کتێب و نوسراوی زۆر دەنوسن و بلاوی دەکەنەوە بۆ لەخشتەبردنی خەڵکی کە بیسەلمێنن کە تەوحید حەق نییە و ئەو شیرکەی خۆیان حەقە

هەروەک خوای گەورە دەفرمویێت(واتە:کاتێ پێغەمبەرەکانیان هاتن بۆلایان بە بەڵگەی ئاشکرا و ڕۆشنەوە،ئەو کافرانە قبوڵیان نەکرد و خۆیان دڵخۆش

کرد بەو زانستەی کە لایان بوو بۆ دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکانیان)الغافر ٨٣

وانـەی( 8 ) لـەشـیـکـردنـەوەی پـەرتـووکـی "كَشْفُ_الشُّبُهَات"

کـۆتـایـی بـەشـی یـەکـەم.........

بـڕگـەی_نـۆیـەم:

بـۆ بـەرنـگـار بـوونـەوەی دوژمـنـانـی دیـن خـۆ چـەکـدار کـردن بـەزانـسـتـی شـەرعـی،واجـبـە

إذَا عَرَفْتَ ذَالِكَ،وَعَرَفْتَ انَّ الطَّرِيقَ الي اللهِ لاَبُدَّ لَهُ مِن اعْدَاء قَاعِدِينَ عَلَيْهِ،اهْلُ فَصَاحَةٍ،وَعِلْمٍ،وَحُجَجٍ فَالوَاجِبُ عَلَيْكَ انْ تَعْلَمَ مِن دينِ اللهِ مَايَصِيرُ سِلاَحَاً لَكَ تُقَاتِلُ بِهِ هَؤلاَءِ الشَّيَاطِينَ الذينَ قَالَ إمَامُهُم،وَمُقَدِّمُهُم لِرَبِّكَ،(الأَقْعُدَنَّ لَهُم صِرَاطَكَ المُستَقيم ثُمَّ لأتِيَنَّهُم مِن بَيْنِ أيديهِم وَمن خَلْفِهِم وَعَن أيْمَانِهِم وَعَن شَمَائِلِهِم وَلاَ تَجِدُ أَكْثَرَهُم شَاكرين)الاعراف ١٦ وَلكن إذَا أقْبَلْتَ علي اللهِ،واصْغَيْتَ الي حُجَجِ اللهِ،وَبَيِّنَاتِهِ فَلاَ تَخَف.وَلاَتَحْزَن(انَّ كَيدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعيفًا)

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"مادام ئەوشت زانی کە پێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان هەمیشە دوژمندارن.وەزانیشت کە ڕێگای خودا و دینی خودا هەمیشە دوژمنگەلێکی هەیە،هەمیشە ئەو دوژمنانە لەسەر ئەو ڕێگایە دانیشتوون،نە هەڵدەستێت و نە وازدێنێ بۆ پیلان گێڕان بەهەموو جۆرێک دژی بانگەوازەکەیان و ڕێبازەکەیان کە #تەوحیدە

کە خاوەنی ڕەوانبێژی و زمانی لوسن،زانستێکی ناحەقیان پێیە،یان فەلسەفەیە یان خەوە یان غەڵـەت حالی بوونە لە بەڵگەکانی قورئان و سوننەت،

واجبە لەسەرت کە فێری دینی خوا ببیت ئەوەندەی کە بۆت ببێت بە سلاحێک کە بەو زانستە بەرانبەر شەیتانەکان بجەنگیت،

ئەو بەچکە شەیتانانەی کە ئیمام س پێشەواکەیان کە ئیبلیسە بە پەروەردیگاری گووت(واتە:ئەی خودایە سوێند بەتۆ کە منت لادا لە ڕێگای ڕاست،دەبێت دابنیشم بۆیان لەسەر ڕێگا ڕاست و ڕەوانەکەت،بۆ ئەوەی لایان بدەم لەسەری،پاشان دێم بۆیان لەبەردەمیانەوە،وە لەدوا وەیانەوە،زۆربەی عەبدەکانت دەبینیتەوە کە سوپاسی تۆ ناکەن،واتە شیرکت بۆ پەیدا دەکات)الاعراف ١٦بەلام نەیگۆت:لەسەرووویانەوە دێم بۆیان،چونکە ناتوانێت ڕێگای ڕەحمەتی خوا بگرێت

#ابن_عباس لە #تەفسیری ئەم ئایەتەوە

دەفرموێت"#لەبەردەمیانەوە واتە:لەبارەی ئاخیرەت گومانیان بۆ درووست دەکەم، #لەدواوەیان واتە:دونیایان لەبەر چاو دەڕازێنمەوە #لەڕاستیانەوە واتە:لەکردەوە چاکەکان ساردیان دەکەمەوە #لەچەپیانەوە واتە:هەوڵ دەدەم کردەوەی خراپیان پێ ئەنجام بدەم

مادەم ئەوە ڕێگاکەت بێت و ئەوانەش

دوژمنەکانت بن،کە دەبینیت هەموو تواناکانیان خستۆتە گەڕ بۆ دوژمنایەتی کردنی دینەکەت و ئەهلی دینەکەت،کەواتە واجبە لەسەرت کە هەموو توانای خۆت بخەیتە گەڕ بۆ پوچەڵکردنەوەی پیلانەکانیان،هەتا بیسەلمێنیت کە بەڕاستی عەبدی خودایت،

بەڵام دڵنیابە و مەترسە،چونکە #یەکەم ئەگەر دوو شەرتت لە خۆتا بەدی هێنا:

١_ئەگەر بە دڵ و بەجەستە ڕووت کردە خودا و تەنها پشتت بە خودا بەست

٢_لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵت دا بۆ فێربوونی عیلمی شەرعی و بە جوانی گوێت گرت لە بەڵگەکانی خودا و ڕوونکردنەوەکانی لە قورئان و سوننەتدا

#دووەم:مەشترسە چونکە(واتە:بە تەکید پیلانی هەموو شەیتانەکان و بەچکەکانیان یەکجار لاوازە)القران

لەبەرانبەر پیلانی خوا،چوونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ خودا بیت دڵنیا دەبیت کە خودات لەگەڵدایە و خوداش وەعدی داوە کە سەربازەکانی خۆی سەردەخات وەک دەفرموێت(وَانَّ جُندَنَا لَهُمُ الغَالبون)الصافات

ئەم بڕگەیە ڕوونی دەکاتەوە کە فێربوونی زانستی شەرعی واجبە لەسەر هەموو موسلمانێک،بەتایبەت زانستی #تەوحید_و_عەقیدە بۆئەوەی بتوانێت ڕەددی دوژمنانی دین و ئەهلی بیدعە بداتەوە

#بـڕگـەی_دەهـەم:

🙋ئـەهلـی تـەوحـیـد هـەمـیـشـە سـەرکـەوتـووە بـا عـەوامیش بـێـت🙋 👆

وَالعَاميُّ مَنَ المُوَحّدين يَغْلِبُ الأَلْفَ مِن عُلَمَاء هَؤَلآءِ المُشْرِكين كَمَا قَالَ تَعالي(وَإنَّ جُندَنَا لَهُمُ الغَالبونَ)الصافات ١٧٣

فجُندُاللهِ هُمُ الغَالبونَ بِالحُجَّةِ وَاللّسَان كَمَا هُمُ الغَالِبونَ بِالسَّيْفِ وَالسِّنَان،وَانَّمَا الخَوْفُ عَلي المُوَحِّد الذي يَسْلُكُ الطَّريقَ وَليْسَ مَعَهُ سِلاَح

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"هەرکەسێکی عەوام کە ئەهلی تەوحید بێت زاڵ دەبێت بەسەر هەزار زانای موشریکدا هەروەک خودای بڵند فەرموویەتی(واتە:بە تەئکید سەربازەکانی ئێمە سەرکەوتوون)الصافات

کەواتە سەربازەکانی #الله سەرکەوتوون بە بەڵگە و بە زمان،هەروەک سەرکەوتوون بە #شمشێر و بە #ڕمـان،

مەترسی دۆڕانیش تەنها لەسەر ئەو #یەکخوداپەرستەیە،کەدەکەوێتە ڕێگا و هیچ سیلاحێکی پێ نەبێت،واتە:زانستی پێ نەبێت بۆ بەرپەرچدانەوەی گومانی گومڕایا

#تـێـبـنـی/موسلمانی عەوام کە چەکی زانستی پێ نەبێت،نابێت بڕواتە جەنگی مناقەشەوە بەرانبەر بیدعەچی س گومڕاکانەوە،وە خۆشی توشی دۆڕان بکات،

"جندالله" مەبەست لەسەربازەکانی #الله ئەوانەن کە خودا هەرچیەکی و

اجب کردبێت لەسەریان جێ بەجێیان کردووە،کاریان بەو زانستە کردووە،کە خودا فێری کردوون،گوێیان گرتووە بۆ بەڵگەکانی خودا،بەعزیمەت و ئیخلاسەوە،بانگەوازی خەڵکیش دەکەن بۆ ئەو ڕێگایە

#بـڕگـەی_یـازدەهـەم:

قـورئـان پـڕە لـەو بـەڵـگـانـەی کـە ڕەددی گـومـڕایـی دەداتـەوە

وَقَدْ مَنَّ اللهُ عَلَيْنَا بِكِتَابِهِ الذي جَعَلَهُ(تِبْيَاناً لِكُلِّ شَيءٍ وَهُديً وَرَحْمَةً وَبُشْري لِلْمُسْلمينَ)النحل ٨٩،فَلاَ يَأْتِي صَاحِبُ بَاطِلٍ بِحُجّةٍ الاَّ وَفي القُرْآن مَا يَنْقُضُهَا،وَيُبَيّنُ بُطْلاَنِهَا كَما تَعالي(وَلاَ يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ الاَّ جِئنَاكَ بِالحَقِّ وَاَحْسَنَ تَفسيرَا)الفرقان ٣٣

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"ئەڵبەتە خودا ئەو منەتەی کردووە بەسەرماندا بە قورئانەکەی کە کردوویەتی بە #تِبْيَاناً ڕوونکەرەوەی هەموو شتێ واتە ئەوشتانەی کە ئینسان پێویستی پێیەتی لە ئەمر و نەهی و حەڵاڵ س حەرام و حدود و ئەحکام #وَهُدي ئەو قورئانە هیدایەتە بۆ زانستی بەسوود و کردەوەی چاکە #وَرَحْمَةً ئەنجامەکەشی ڕەحمەتە چونکە پاداشتی دونیا و ئاخیرەتی تێدایە، #وَبُشْري_لِلْمُسْلمين ئەم قورئانە مژدە و مزگێنی یە بۆ ئەو کەسانەی کەکاری پێدەکەن"النحل

هەرکەسێک کەخاوەنی هەر ڕێبازێکی ناحەق بێت،هەر بەڵگەیەک بێنێتەوە بۆ خۆی ئیلا لە قورئاندا یان لەسوننەتدا ڕەددی ئەوەی تێدایە کە بەڵگەکەی پوچ بکاتەوە ڕوونی دەکاتەوە کە بەڵگەی ئەو گومڕایە ناحەقەیە،

"وَلاَ يَأْتونَكَ بِمَثَلٍ: ئەو گومڕایانە هەر جۆرە بەڵگەیەک کە دەیهێننەوە جار هەر جۆرە قیاسێ بێت،یان هەر جۆرە گومانێک بێت

الاَّ جِئْنَاكَ بِالحَقّ وَاحسَنَ تَفسيرَاً:ئیلا خودا لەبەرانبەر ئەوەدا حەق و ڕاستی تەواوی داوە پێمان کە ڕەددی ئەوان دەداتەوە،وە جوانترین ڕوونکردنەوە و تەفصیلاتی داوە پێمان،

قَالَ بَعْضُ المُفَسّرينَ: هَذَهِ الايَةَ عَامَّةَ في كُلِّ حُجَّةٍ يَأْتي بِهَا أَهْلُ البَاطِلِ الي يَوْمَ القِيَامِة

---

هەندێک لە تەفسیرناسان دەڵێن: ئەم ئایاتە(ایە ٣٣ سورەتی الفرقان) هەموو بەڵگەیەک دەگرێتەوە کە ئەهلی باتڵ دەیکەنە بەڵگەی دەستیان،هەتا ڕۆژی قیامەت

وانـەی ( 9 ) لـەشـیـکـردنـدوەی پـەرتـووکــی "كَشْفُ_الشُّبُهَات"

بـەشــی دووەم....(رەددی گـومـانـەکـان)

"ڕەدد و وەڵامــی گـشـتـگـیـر بـۆ گـومـڕاکـان"👇

وَانَا أَذْكُرُ لَكَ أَشْيَاءٌ مِمَّا ذَكَرَاللهُ فِي كِتَابِه جَوَاباً لِكِلاَمِ احْتَجَّ بِهِ المُشْرِكونَ في زَمَانِنَا عَلَيْنَا،فَنقول:جَوَابُ أَهْلِ البَاطِلِ مِن طَرِقَيْنِ:مُجْمَل،وَمُفَصَّل:امَّا المُجْمَل فَهُوَ الامْرُ العَظيم،وَالفَائِدَةُ الكَبيرَةُ لِمَن عَقَلَهَا،وَذالِكَ قَوْلُهُ تَعَالي( هُوَ الذي انزَلَ عَلَيْكَ الكِتَاب مِنْه ايَاتُ مُحْكَمَاتُ هُنّ امُّ الكِتَابَ واخَر مُتَشَابِهَات فَامَّا الذِينَ فِي قُلُوبِهِم زيْغُ فَيَتّبِعُونَ مَا تَشَابَه مِنْه ابْتِغاءَ الفِتْنَة وابْتَغاءَ تَاوِيلَه وَمَا يَعْلم تَاوِيلَه الأ َ الله)ال عمران ٧

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"منیش چەند شتێکت بۆ باس دەکەم،کەخودا لەکتێبەکەیدا باسی کردووە،ئەوانەش دەبنە وەلام،بۆ ئەو قسانەی کە موشریکەکانی ئەم زەمانەی خۆمان کردوویانن بە بەڵگە بەسەرمانەوە

دەڵێین وەلامی ئەهلی باتل بەدوو ڕێگە دەبێت:

١_وەڵامــی گشتگیر

٢_وەڵامــی ورد و تەفصیلی.

وەلامی گشتگیر کارێکی گەورەیە و سوودی زۆر گەورەی هەیە،بۆهەر کاتێک و بۆ ڕەددانەوەی هەموو گومان و شوبهەیەک دەبێت،ئەم وەڵامـە گشتگیرەش لەم ئایەتە وەردەگیرێت کەخودا فەرموویەتی(واتە:هەر ئەو خودایە ئەم قورئانەی دابەزاندووە،بۆسەرت هەندێکی ئایەتە موحکەمەکانن واتە:ئەوانەی کە مەعناکانیان ڕوون و ئاشکرایە،بۆ هەموو کەس،تەنها یەک مەعنایان هەیە و پێچ و پەنایان نییە،ئەوانە ئەسڵ و ئەساسی قورئانن،وە هەندێکی دیکەشی موتەشابیهن واتە: مەعناکانیان لای هەموو خەڵکی تەواو ڕوون و ئاشکرانییە و چەند مەعنایەک هەڵدەگرن،ئینجا ئەوانەی کە لەدڵیاندا نیەتی ئەومیان هەیە کە لەحەق لابدەن و شوێن کوفر بکەون یان شوێن بیدعە بکەون یان شوێن ئارەزووەکانیان بکەون ل،،سێ نیشانەیان تێدایە:👇

١_واز دەهێنن لەو ئایەتانەی کە موحکەمن واتە ڕوون و ئاشکران خۆیانی لێ گێل دەکەن،ئینجا دەگەڕێن بە شوێن ئەو ئایەتانەی کە موتەشابیهن واتە:ئەوانەی کە مەعنایان تەواو ڕوون نییە و چەند مەعنایەک هەڵدەگرن

٢_مەبەستان ئەوەیە کە خۆیان و خەڵکیش توشی لادان و گومڕایی بکەن

٣_مەبەستیان ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان بە ڕەئی و ئارەزووی خۆیان تەفسیر بکەن

بەڵام هیچ کەس تەئویل و واتای ئەو ئایەتانە نازانێت جگە لە #الله هەروەها ئەوانەش کە کە زانستەکانی شەریعەتدا چەسپاون دەیزانن

وَقَدْ صَحَّ عَن رَسولُ الله صل الله عليه وسلم انَّهُ قَال(إِذَا رَأَيْتُمُ الذينَ يَتَّبِعونَ المُتَشَابه وَيَتْرَكون المُحْكم فَأُولئِكَ الذينَ سَمَّي الله في كِتَابِهِ فَاحْذَروهم)صحيح البخاري ٤٥٤٧

---

#ڕوون_كـردنـەوە

"پێغەمبەرگیان صل الله علیه وسلم فەرموویەتی(هەرکاتێ ئەوانەت بینی کە دەگەڕان بەشوێن ئایەتە موتەشابیهەکاندا، ئا ئەوانە ئەوانەن کە خودا،باسی کردوون حەزەریان لێ بکەن)

#ڕوونکردنەوە

حەزەریان لێ بکەن واتە: تێکەڵاویان مەکەن گوێیان لێ مەگرن و سەیری کتێب و نوسراوەکانیان مەکەن،خۆتان دوور بگرن لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان،نەوەک شتێکی ناحەق بڕواتە دڵتانەوە دوایی بەئاسانی لە دەستی دەرباز نابن

#امام_بغوی دەفرموێت:ئەصحاب و تابعین و شوێنکەوتوانی ئەوانیش و زانایانی ئەهلی سوننەت کۆک و هاودەنگن لەسەر دوژمنایەتی کردنی ئەهلی بیدعە و دوور کەوتنەوە لێیان"شَرْحُ السُّنَّة ج١ ص٢٢٧

مِثَال ذَالِكَ: إِذَا قَالَ لَكَ بَعْضُ المُشْركين

(الاَ انَّ اوْلِيَاءِ اللهِ لاَخَوْفٌ عَلَيْهِم وَلاَهُم يَحْزَنون)يونس ٦٢،وانّ الشَّفَاعَةَ حَقٌّ،وانَّ الانْبيَاءَ لَهُم جَاهٌ عِندَ الله،او ذَكَرَ كَلاَمَاً لِلنَّبي صل الله عليه وسلم،يَسْتَدلُّ بِه عَلَي شَيءٍ مِن بَاطِلِه وَانتَ لاَ تَفْهَم مَعْنَي الكَلاَمِ الذي ذَكَرَهُ

---

#ڕوون_کـردنـەوە

"نمونەیەکی ئەوەی کە موشریکان ئایەتی موتەشابیهـ دەکەنە بەڵگە،نمونەی وەلامەکەشی ئەمەیە: ئەگەر موشریکێک گووتی:خودا فەرموویەتی(واتە:بە تەئکید ئەولیاکانی خودا هیچ جۆرە ترس و خەوفێکیان لەسەر نییە و غەمباریش نەبن)یونس٦٢

وە"شەفاعەتیش" حەقە و پێغەمبەرانیش لای خودا پلەیان بەرزە و ئێمەش داوا دەکەین لەو پیاوچاکانە لای خودا تکامان بۆ بکەن،یان ئەگەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری باس کرد،کردیە بەڵگە لەسەر گوتە و ناحەقیەکانی و کارە ناحەقەکانی،تۆش لەو حاڵـەتەدا بەو جۆرە تێ نەدەگەیشتی کە ئەوباسی دەکات،نەشتوانی وەلامـی تەفصیلی بدەیتەوە،ئەوا بچۆرە سەر ئەم وەڵامـە گشتگیرە و بەسێ خاڵ جوابی بدەرەوە و بڵێ: 👇

فَجَاوْبَهُ بِقَوْلِكَ: انَّ اللهَ ذَكَرَ انَّ الذينَ في قُلوبِهِم زَيْغٌ يَتْرَكونَ المُحْكَم،وَيتُبعونَ المُتَشَابِه

---

یـەکـەم:بەتـەئکید #الله لە کتابەکەیدا باس

ی کردووە کە ئەوانەی لە دڵیاندا نیەتیان هەیە لابدەن لەحەق،واز دەهێنن لەو ئایەتانەی کە مەعناکانیان لای هەموو کەس ڕۆشنە و تەنها یەک ماعنا هەڵدەگرن،وەک تۆ ئەی موشریک کە وازت لەو ئایەتە هێناوە کە فەرموویەتی"فَلاَ تَدْعوا مَعَ اللهِ احَدا"

بەدوای ئەوەدا گەڕاویت کە پێغەمبەر فەرموویەتی"ان الشفاعة حق" بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆت لێکی بدەیتەوە

وَمَا ذَكَرْتُ لَكَ مِن انَّ اللهَ ذَكَرَ انَّ المُشْرِكينَ يُقَرِّونَ بِالرُّبوبِيَّةَ،وَانَّهُ كَفُ ِرَهُم بِتَعَلِّقِهِم عَلي المَلائِكَة،اوِ الانْبِيَاء،اوِ الاولِيَاءُ مَعَ قَوْلِهِم(هَؤُلاَءَ شُفَعَاؤُنَا عِندَ الله)يوتس ١٨

وَ هَذَا امرٌ مُحْكَمٌ بَيِّن،لاَيَقْدِرُ احَدٌ ان يُغَيِّرُ مَعْنَاهُ

---

دووەم:ئەوەشم بۆت باسكرد تۆش بۆی باس بكە كە خودا باسی موشریكەكانی كردووە،كە ئەوان دان دەنێن بەوەی #الله هەرخۆی پەروەردگارە باسی ئەوەش كراوە كە ئەو موشریكانە بەوە كافربوون كە داوایان لە فریشتەكان و پێغەمبەران و پیاوچاكان دەكرد،لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت ئەوانە تكا كار و شەفاعەتكاری ئێمەن لای #الله

ئەم مەسەلەیەش بە تەواوی ڕوون و ئاشكرایە و هیچ پێچ و پەنایەک هەڵناگرێت،هیچ كەسیش ناتوانێت مەعناكەی بگۆڕێت

ذَكَرتَهُ لي ايُ ُهَا المُشْرِكْ مِنَ القُرآن،اوْ كَلاَمَ النَّبي صل الله عليه وسلم،لاَاعْرِفُ مَعْنَاهُ،وَلِكن اقْطَعُ انَّ كَلاَمُ الله لاَ يَتَنَاقض.وَانَّ كَلاَمُ النِّبي لاَ يُخَالِفُ كَلاَمَ اللهِ وَهَذَا جَوَابٌ جَيِّد سَديد،وَلكِن لاَ يَفْهَمُهُ الأ َ مَن وَفَّقَهُ الله،

فَلاَ تَسْتَهِن بِهِ،فَإِنَّهُ كَمَا قَالَ تَعالي

(وَما يُلَقِّاهَا الاَّ الذينَ صَبَروا وَمَا يُلَقَّاهَا الاَّ ذو حَظٍّ عَظيم)فصلت ٣٥

---

سێـهـەم:ئەوەی كە بۆ منت باس كرد لە قورئان و فەرموودە ئەی موشریک! من بەو جۆرە لێی تێ ناگەم كە تۆ باسی دەكەیت،بەڵام دڵنیام كە ئایەتەكانی خودا پێچەوانەی یەكترنین،وە دڵنیاشم كە فەرموودەی پێغەمبەر پێچەوانەی كەلامی خودا نییە، واتە: ئەو ئایەت و فەرموودانەی كە تۆ دەیهێنیتەوە پێچەوانەی ئەوانە نییە كە من بۆتم باس كرد

ئەمەش وەڵامێـكـی ڕاست و تەواوە،بەڵان تەنها ئەو كەسانە حاڵـی دەبن كە خودا هیدایەتی داون

ئەم وەڵامـەش بەكەم مەزانە،چوونكە هەروەک خودا فەرموویەتی(تەنها ئەو كەسانە ئەمە وەردەگرن كە صەبریان هەیە،تەنها ئەو كەسانەش وەری دەگرن كە خودا بەشێكی گەورەی پێداون

